




سالْي 1959 لة شاري سةقز لةدايك بوومة

ماوةي 8 سالَ مامؤستاي قوتا   انة بوومة و ئينجا ماوةيةك زيندان و ماوةيةكي ديكة و داجار ماوةيةكي ديكةش و..

لة سالْي 1978ةوة دةستم داوةتة نووس    بةزما    نةتةوةكةم و لةم بوارانةي خوارةوةدا نووسيومة؛

شيعر:

سةمفؤنيا

دياري

هةزار ديوا    كةلْةطةت لة ثرسةدا

درؤكا    موقةددةس

شيعرةسات

بةذمارةي تةلةفؤنةكا    عالةم

درؤكا    ئةشق و تابؤكا    دةمامك

رةخنة:

لةذيَر تيشكي رةخنةدا

/ كؤوتاري رةخنة و خويَندنةوةية كة زؤربةيان لة طؤظارةكا    كوردي دا بلاَو كراونةتةوة/

شانؤنامة:

كاية/كة هةرطيز مةوداي كايةي ثيَنةدرا..

دةوران دةوران...

. و...

که تۆ رۆشتی باوان

مردن هاتن

به هەموو دێوجامەکانی نەبارین

بارین

......

.......

.........

پێیشکەش به باوان و

هەموو ئەو ساڵە فانتازیاییانەیپێکەوە ژیاین

هەروەها، پەری و بێگەرد و سوارۆ و سۆران که بیست ساڵ رەنجی

ژیانی شاعیرانەیان لەگەڵ کێشام.

- 1 -

ئەگەر شێتی چاوی سەر ما بردووی

روح وبەزمی ئەستێرە هەمووی

مۆسیقای شەوانە

رەنگە به سەر تەمی

"جن جن"یوی سەرم

هەزار جار و بار به ئێواران

بفرۆشنم ئاشقترین

من بارەشەی.. هەشم

هەموو رۆژانێ به شەو

ڕەنگە پاییز تەمی جن.. جنی
شە وانم   بفرۆشتوێنیٚ
بەزمی.. ڕەنگە..
باشترین ئاشق ؟
ئەبینم چۆن تامم ئەکەی
وەک تامت ئەبینم لە جن..
جنی سەری
ئێواران...
بە لەرەی مەمکەکانتا
تامت شـــــــــۆڕ
ئەبێتە
و
ه
بۆ چاوم         منیش ،
ڕەنگە پاییز بمرِنی
تا شەو دێتە بیری
ئاشقترینم تام
ئەوینترینم  بۆن
خۆشەویستترینم چاو

مەمکەکانت شەوان
......................
/ بێـــــــــــــــــــدەنگی/
ئیتر نە من هەتا .....سالیٚ
کابل و
نە ئەشکەنجەش...چاوی
جار بە جار لەشم
ئەوەیە ئازیز  !  من
ئەگینا :
تـــــــــــۆ...هەر ڕۆژان
ئاشقترینم شەوان
تام... بۆن... تۆمن...
منتو....
بەسە مەیانگری !
بەزمی مانگ  هەمووی
تەمی خەمە نە مۆسیقا
ئەدزیٚ...تەمی سەرم
جن.. جن.. یو.. ئێواران بۆ شەو
هەتاویش نەخوازەلاٚ

سەریٚ لەم سەر توٚپەکەش

بدا... روٚژ

توٚ با رەشەی.. هەشی

لەشی... رەش

بە پالٚ حەساری ئێوارانا

پاییز خەمترین گەلاٚ زەرد

من ..

بەهار گەشترین گولٚ توٚ

مەلەرێوە... بوٚنت... کەڕ

من

شوٚڕ

ئەبێتە

وە

بوٚ چاوم

هـــــــــــــــــــــــه

نـــــــــــــــــا ســــــــــــەت

ئاخرین هەتاوم... ئەریٚ یاد

نایەتەوە بە چاوەکانتا... یاد

یاد

یاد

ئەستیرٚەش فروٚشتمی

شەوان

دێتە خوار

بوٚ سەر سینگم... پڕ ر

ه

ش ئەریٚ ـــ کەژ نا

ئاو

تراویلکە ....

ئاشقترینم من

ئاشقترین رەنگە توٚ... نا

رەنگە.. ئەریٚ

ئاسمان... رەنگە پاییز

بمرِنیٚ

........ بیـــــــــــــــــــــٚدە نگی..........

با... چاوی جار جار لەشم

کابل ..

ناحەزترینم ئەشیٚ... بوٚ

لە سەرما لەشی
جن جن..یوی ....تۆ
ڕەنگە پاییز هەڵشێعری
تۆ... مژینی کارەسات
شیعرەسات ڕەنگە
بەهار زستان ئەمساردێنێ..
و
خۆزگە... مەلەرێوە...
وەك جاران
جار جار سەرم... بۆ... شۆڕ
ئەبێتەوە
تیزاوی سەراب ... بۆ
من چاوم
تۆ لەشت
هەموو بەیانیەك... نا...
بەیانی هەموو
چاوت...من
چاوم تۆ
منتـــۆ

هەتا ساڵێ... نە ئیتر من
کابل و
چاوی جار بە جار لەشم..نە ئەشکەنجە
بەسە مەمانگری !
ئیتر نە من شۆڕ ئەبێتەوە
بە لەشتا
بۆن
بـەرام
ئیتر نە چاوم لەرەی سێوەکانت
شـــــــــــۆڕ
بوونە
و
ه
لـــــەشـــــــم
من تا... هەتا... تۆ
مەمگری... بەسە
سەرماسەرم نا سەرم...
سەرما ...

شێعرەساتی یەک لە دوایین بەشی دیوانی

درۆکانی موقەددەسدا هاتووە.

هەرچی سێوەمەمنووعەیە حەقیقەتن

باوان!

بازجۆکانم بەقەد ئستالین رۆشنبیر بوون و

هەڵیانئەکابلانم ...

منیش :

شێت بووم و ئەم نیچە ان ...

/ قەحبەیی دنیایە ئەگینا

مێژوویان بە ناوی شێتێکەوە نەدەکرد بە دوو

/بەشەوە...

کارتێلەکانی « سیبرنێتیک »

لە پەسا «سووپەرمەن »مان بۆ ئەتاشن



«سووپێر» ژن...

نیشانەکان بوونەتە سوڵتە و

بەردەوام لێمان ئەگۆڕن

***زمان تەنیا ئالأی سەدەی بیستە باوان!***

بەکام زمان بتخۆشەویستێنم

منێ کە زمانی "ئینترنت "نازانم

نابێ ئاشق بـــــــــــــم؟؟؟

نازانم

لەئمپراتۆرستانی ئینتێرنێتا

کچان بە نامەی کوڕێ ئەگرن یا نە ؟

لەجیهانی "هێرمنۆتێکی " ئەوانا

رەنگە وشەی ئاشتی ئێمە

بەهۆ ی " ش "ینە خەستەکەیەوە

مانای شەڕ بات

وەك چۆن کە باسی *Peace* ئەکەن

ئێمە دڵنیاین شەڕێکی پیس هەڵدەگرسێ و

ئەمانکوژن ...

هەزار «بودریار» یشیان هەیە کەبڵێن:

«مەترسن !

شەڕەکان تلویزیۆنین !»
/دەرەقەتیان نایێن باوان!/
با هەر باسی ژوان ەکان کەین
ڕەنگەکانی ماچ بشیعرێنین
چـــــــــــــــــــــــــــم
چـــــــــــــــــــــم
چـــــــم
................................
بەناوی سیاسی نەبوونەوە باوان
هەزارسیاسەتی حیزیان خستۆتەباخەڵمان
/ ژوورەکانمان /
دەفتەرەکانمان
تەنانەت کوڵی قەڵەمەکانمان
/بۆ نەترسم باوان بۆ ؟
هەر تۆم ماوە
چووزانم کامە سیاسینەبوونی تر
لێتم نەسینن...
لێمت نەکەن...؟
با هەڵماچین...

چاوەکانم هەڵنۆشـــــــــە...
ئەزانم ئەتینووی
ئابە تۆزاڵێ خەندە
با لە شیعرنەبمەوە...
ئەزانم شیعرت پێخۆشە باوان!
وەک من تۆم پێخوشە
منتۆم ...تۆ من....
بمخۆرەوە باوان!
ئەم شیعرە بە خواردنەوەم نەبی ناتەواوێ
- ئەمجار ئەبێ خۆشم بخۆمەوە بۆ تۆ ؟
- ئەی ماچ...؟
ئەی شیعر...؟
تینوویەتیم بەچاوەکانت ئەشکێ
هەتیو مەکە !
- هەرچی سێوە مەمنووعەیە حەقیقەتن باوان!
بمنۆشە با جارێکیتر نەمکابڵێنن
بەرگەی تەوژمی ئەمجارە ناگرین باوان !
تا نەمخواردوویتەوە
هەڵمنۆشە !

من تۆم باوان منتۆم... مەترسە !

سیبرنتیك .. زمان.. سیاسەت.. هێرمنۆتیك

/ دەســـــــــــــــەڵات /

بەرگە ناگرین باوان

بەرگە ناگرین

ئێمە خۆ زمانی ئینترنێت نازانین

زمانی کابل نازانین

تا ماچ یشیان نەگۆڕاوە

زووکە باوان!

لە دنیای هێرمنۆتیکا، ئەتوانن بمانشێتێنن

⇓

تیمارستان

ـــ ئەتوانن بمانئاژاوێنن

⇓

ئاژاوەچی و

⇓

زیندانستـــــــان

ـــ ئەتوانن بمانسانسۆرێنن

⇓

هەرهیچستان ...

ـــ ئەتوانن بمانسووتێنن

⇓

ئاگرستان....

ـــ ئەتوانن باوان...

ـ ئەتوانن....

کارتێلەهێزە زمانیان

بەشمشێری شەپۆلە ئاسمانییەکانیان /

بەزمانی فەیلەسووف ەکانیان

بە چەکی دەست مەڕەکانیان /

بۆ هەر کەناڵێ تۆ بڵێ ی...

ئەمانکێشن...

/ئاخ "نیچە"..ئاخ ..بڵێم چت لێبێ /

هەرچی تەشی جیهان رستی

کردتە پەموو!

زووکە ... باوان

هەر چی لارێ و دزەرییە راستین !

زووکە !

هەڵمنۆشە

منتۆم....

ئۆمن !

– هەتیو مەکە...نا ...نا...

– □ –

## زمـــــان

حەزەکانم

لەجامێکی لێو باریکی ئەفسانەیی...

ئازارەکان

حەزترین بوون

لەتاو باریکە ئاسمانی ژینی ژیری

خۆزگە رەنگە شاوشەی نیو *شیعرەکان*

تاسە، رەنگە

هەم وەزیری دەسە راست و

هەم دەسەچەپ دیوانەکەم......

ئاخ

ئەی حەزی چەندجارەکی

نووسراوە رەقەڵەکاانم !

من حەزترین ئازارەکانی جیهانم

ئازارترین حەزەکانی پەڕەی زەمەن

ز....ە......م.....ە......ن زامە

زامی زەمەن .... زامترینم

درێژترین ساتەکانی شیعرە ساتم

چ ساتێ بوو ... ساتام

– ساتە سرێشیەکانم!

لاچن !

ساتە لە هیچ رەنگێ نە چووەکان / وێڵمکەن/

ساتە رەشتاڵەکان لە کوێن ؟

ساتە خوێنپرتقاڵیەکان..

لە هەمووتان ناترسم

——— ئەترسم ئەگر نەترسم ————

ساتەچواردە ساڵەییەکان !
بە سینگ  و بەرۆکە هرەمیەکانتانەوە
لێوی مژینم مەبڕن .... ئەترسم
ئەم ترسانە نەبێ چیبکەم
چۆن ئەوەندە ئازا ئەبووم
ئەگر ئەوەندە ترسەنۆک نەبوایەم
/ساتەکان "دال" ێکن
تەعمیم لە بوونی مێژوو ئە کەن
/ مێژوو ج... مێژوو ز
/من مەدلوولی هەموو دالەکاَنی پێشووم...
/...مێژووم
رەنگە هەر دالێ بم ...
نازانم
ئەزانم هەموو شتێکم خۆم نەبێ... تۆ نەبێ
ساتە ئاورێشمیەکانیان دزیم
ئەم ساتە رەق و تەقەیان دامێ
ئەم ساتە ساردانە
ئەم "بازجو"ە نگریسە    ساتە...
من و سات ... سات و من هەمووین

ئەگەر ئەم زمانە نەحسە نەبوایەت
ئەرێ ...
ئەگەر ئەم زمانە دوو/ هەزار/ رووە نەبوایە
ئەگەر زمان نەبوایە
من زەمەن بووم
نەبووم
بووم
نازانم ...
هەر ئەزانم  / من هەموو شتێکم  خوم نەبێ
تو نەبێ ... باوان ! /
..........................................
/ ئەو ساتانەی  سات  هیچ نەبوو جگە
دۆزینەوەی غارێ بۆ ژیان وجگە
راوی چەن دەعبایەک بۆ ژیان و ..
ئاو  و  گان و خەوتن و هیــــــــــــــــــچ ... /
رەنگە زمان ئاماژەیەکی تەنیا بوو
بۆ پیشان دان
رەنگە زمان مامەڵەیەکی سادە بوو
لەنێوانی شتەکانا .

رەنگە «خوای گیان»
بۆ ئەوەی بڵێ : ســـــێو مەخۆن
/ بەسەر و دەست و تووڕەیی نێو چاوانی
حاڵیٚ کردم ... بیرم نیە /
تا تۆ هاتی .. فێرت کردم
یەکەم وشە نا ..... نا ..... نا....
زمان یەکەم شەڕی پیٚ ساز کردین :
"..................................."
زمان جوانی و ناشیرینی لێك کردەوە
/ **زمان بەوبەخ کردین...باوان** /
زمان دووهەم شەڕی پیٚ ساز کردین
یەکەم برام بەوشەی بەرد سەربڕی....
فێری یەکەم داگیرکردنی خاك و
ئاو و
ئاگرو....
وشەی " با " بوو
خۆی نە ئەدا بە دەستەوە ...
تۆ شیعرت ساز کرد
بۆ داگیر کردنی « با » و

ئاســــمان و
ئەستێــــــــــــــرە و
خــــــــــــــــــــــــــۆر ....
شێعر/ ئەونەی تر/ بەوبەختی کردین باوان !
/ شیعر فێری کردین
هەمووشتیٚ بۆ داگیرکردن ئەشیٚ .... /
شەڕەکان رەنگە شێعریان ساز کرد
شێعری داگیر کردنی زیاتر ...
/ خەتا کان هەمووی لە تۆوە بوو .../
ئەشقیش ............................
ئەریٚ باوان !
ئەشقیش تۆ سازت کرد
/کاتیٚ لە رووی نازەوە
شێعرت کردە پیشە و
بە باوکت گوت: نەتمدەنیٚ /
ئەشقیش و رە قیبیش...
هەتا رەقیب نەبوو باوان!
/ زمان هێشتا دوو روو نەبوو
زمان هێشتا ئەونە نەحس و زاڵم نە بوو

خەڵك  بە زمان نەدەخڵەتان.... /
بۆ وەی، باوان
رەقیبیش زمانی خۆی هەبوو
بۆیە حەقیقەتێک نەما..
/تۆش نەتزانی من راست ئەکەم یا ئەو ؟/
سەد مخابن
زمان سیمای من و ئەوی تێکەڵاو کرد
من مامەوە و سەداقەتی رووی ئەشقەکەم
ئەو و خەیانەتی شەهوەت ...
/لە نێوانی من     و     ئــەو دا
تەم و مژ ...
دواجاریش تۆ
/ تۆ و
شیعر و
زمان باوان !
تۆ و شیعر و زمان و یوتوپیاکانی سەرکەوتن!!
/ قەت نەسازا / و
"حەوتخان"ەکان باری شانی منی کلۆڵ
نە کەوشی پۆڵا بەرگەی گرت ...

نە گۆچانی ئەشقەکانی راستەقینە/!!!/ و
نـــــــاراستەقینەی  جیهـــــــان و
نە تۆشـــــــــــــەی شیعـــــــــــــر
رێگـــــــا لەوە درێـــــــــــــــــــــژتر بوو
نەمانزانی
چوارریێکان و هەزار رێ گان ئەوەندە بـــــوو
تەمەنی مێژوو نەیتوانی بیبانبڕێ...
من تامەزرۆ  و
چیها شارێ  و دزەرێگەی  نەپیوراوە
هێشتا ماوە...
/ چیها رێگە مەمنووعەیان
ئەنایە دەمی یا ساوە...../
چیها شێتە رێبوار چوون و
هەرگیزیش نەگەرانەوە.....

——————............——————

لە شیعر تێپەریوە باوان!
ئەم زمانی دەسەڵاتە
لە ئەشق تێپەریوە باوان !
ئەم سەردەمی دەسەڵاتە

لە حەقیقەت/ !! / تێپەریون
ئەم لەحەقیقەت چوانە باوان...
هەزار وێنەی چاوی نازت
بە شەقاما هەڵواسراوە و
لە تۆش ناچن
/ئەونە نەبی،
بە زمانی ئێستای دەسەڵات لێی نووسراوە،
" لەیلا "...لەیلا ....
/«رمێئۆ»کەی بێ «ژوولیێت»خۆم
مەجنوونەکەی بێ لەیلا خۆم .......
فەرهادەکەی بێ شیرین..
هەی لاسەکە بێ.....
سیامەنەکەی بێ خەج خۆم.../
ئەی تۆ کوانێ ؟
مشتێ ماچت نەپرژان بە رێگەدا و
رۆیشتی.......................
/ بە کام ناونیشان بتدۆزمەوە ؟ /
هەزار بۆنیان داتاشیوە و
بە هەزاران شەقام و جادەدا

.................. کردوویانە....
کامیان بۆنی هرمەکانتن باوان !
خوابکا بە رێ مەمنووعەدا نەچووبێتی
خوابکا باوان !
/ تۆش وەکوو من /
ئەوەندە شێت نەبووبێتی !
خوا بکا باوان، نەچووبیتە
لە«باخ»چووەکەی دەسەڵاتی رەقیبەوە
خوابکا باوان .. خوا ..
...........................
بۆنت ئەکەم و نایکەم
هیلاکم هیـــــــــلاکم هیـــــــــــلا....
چەمینەوە و هەستانەوە تاکەی باوان ؟
بە ساتەکانت بفەرموو:
ئیتر سواری «با» نەکەن !
نیوە شەوان
بەکۆڵانی مەدا نەفرن !
تاکەی باوان ؟
هیـــــــــــلاکم هیـــــــلا....

هەزاران ساڵە هەڵدێم...

دەکەوم ...

دەسووتێم....

دەممرێنن.... ئەژییێمەوە...باوان !

لە من گەڕێ !

ڕەقیبیش

«باران و زەوی و ئاسمان و خـــــــــــــوا»/

تاکەی باوان ؟ تا کەی...

"حەقیقەت" ێکی تر ؟؟

"ڕاستـــــــــی"یەکی تر ؟؟

"یاسا"یەکی تر ؟؟

دەسەڵاتێکی تر شك نابەی ؟!؟

زمان زمــــــــــــــــــــــان

زمانێکی تر دابێنە باوان !

بە دەست ئەم زمانە هەزار سیماوە

سیماوم و نادیارم

کوژراوم و ڕۆحم تیایە...

نەماوم و ماوم باوان !

..................

......................

ئـــــــەشـــــــــق و شـــــەهوەت

ڕاستـــــــــــــی و درۆ

ئاشتـــــــــی و شـــــــەڕ

خێــــــــــر و زەرەر

بــــــــــــــاوان !

م ن

بوومەتە هەرچی شتە خۆم نەبێ.. تۆ نەبێ..

کەم لە خۆمم دوور خەرەوە

وا هەزار ساڵە ئەکەوم..

هەزاران ساڵە نامرم

ئەم زمانە تاکەی باوان ؟؟

ناکرێ بە ئیماکەی جاران

وەکوو «خوای گیان» قسە بکەین ؟؟

ناکرێ باوان ؟؟ ناکرێ..

---

ئەم قاشە شێعرییە لە سیروانی شمارە ... 1378 دا بلاو بۆتەوە



## وانموودە *

ئەتاندەم بە خۆما و ـــــــــــــــــــــ◄

دێم بنووم وشەکانم !

هەر ئێوە لە واقیعەکان ناچن وبەس



/ لە نەخشەی ئیمپراتۆریەکەی «بۆرخس»ئەچن

تیکەیەکی بچووك و کۆن

/ لە ولاّتێکی گەورە



چ دەوران

دەورانێکە

باوان !

↑

←—— زەمانەی درۆ ——→

↓

/ هەموو وانموود ئەکەین هەین و

/ .. هیچیـــــــــــــــــــــش

هەموو ئەجووڵینە باوان

/ وەستاویشین /

هەموو بە رواڵەت ئەڕۆین و

/ گەنیویشین /

ئـــــــــــــــا......خ ... باوان !

هەموو شۆڕشگێڕین و

/ خائینیشین /

مەســـــــــــــخ باوان !

مەسخێکی ســـــــــــــــــەیر...
لە سیمای خوا نەبیٚ باوان
لە گشت  درِندەیەك ئەچین
لە هەزار روو ترازاوین ..
دوو هەزار رووین !
...................
خۆتم نزیك نەخەیتەوە ئەمرم
هەناسەکانتم تێکەڵ کە با ئوکسیژناوی بم
هەناسە باوان هەناسە !
با نەبم بە کەربونێکی رەش
............
خۆشەویستی نەبی   باوان !
کەس بەرگەی ئەم زمانە ناگریٚ
کەس ئەم جەهەننەمەی بو ناشێعریٚ
/کەس ئەم هەموو دەمامکە لەرووی کەس
داناماڵیٚ /
دەمامك هێند دروست بوونە
بە ژمارەی مرۆڤـــــــ × دوو × سیٚ × هەزار.
/ئەشا ئەو نەگبەتیە باوان !!/

شیعرێکم  ناتوانیٚ
/ بۆ چرکەیەك /
لە سیمای خۆیی هەڵکێشیٚ
/ئەشا ئەو نەحسی یە باوان !/
ناتوانم بە دەمامکەوە هەناسە بەم
بگرِم..............................
ناتوانم بە دەمامکەوە ماچمــــــــاچێن
ناتوانم باوان
قەڵەمێك فێر دەمامك کەم !
لە سەردەمی دەمامکدا ...
دەمامکێکــم بۆ ناکێشــــــــــــــــــــریٚ .
/ چبکەم باوان ؟
دەمامکەکان شایان هەیە .
/ وەزیر و دیوان و دادگا و زیندان و
دار و شەللاق و .../
منیش تۆ   !
تۆیەك کەنازانم فێری دەمامك بووی یا نا  ؟
نازانم باوان
/ دەمامك دەسەڵاتە و من ناتوانم

**/.......بە دەمامکەوە بخۆشەویستێم**

**بتئاڵێنم لەماچـــــــــــــەوە**

**لە شیعـــــــــــــــــرەوە**

**لە ئەفســــــــــــــــانەوە**

**لە حەقیقەتە رەنگـــــــــــاڵەکانەوە....**

**................ناسازەم باوان ! ناسازە ...**

**بڵێی بەردبارانم نەکەن ؟؟**

**«هەللاج»چەن مەزڵووم مــــرد باوان !**

**/ گولسورخی و موختــــاریش... /**

**ناسازە لە جیهانی سازاودا بۆمبە بۆمب..**

**ئەترسم باوان ئەترســـم ..**

**ئابە ماچـــــــــــــــێ !**

**هیچ لە ئەشق تێناپەڕێ ...**

**/ ئەگەر ئێمە ژێرچەپۆک ین ...**

**خەتای ئەستێرەکان نییە**

**خەتای ئەستێرەکان ...**

**خەتای ...**

---

*لە کۆڕە یادی یەکەمین ساڵهاتی کۆچی شێخ نافعی مەزهەر دا خوێندرایەوە لەخۆری ژمارە 3ـــ2 ش دا بە هێندێ حەزفەوە **بڵاو کراوەتەوە**.

## – گەڕانەوە –

ئەگەڕێمەوە بۆ ئاســـــــــــــــــــمان
ن ا م س ئـــــا
بە "چڵ چەمە"دا سەرئەکەوم ... فڕم
فــــــــڕ
یا بە داری سەر وەنەوشەدا ئەفـــــــڕ
ئەچمە باوەش "......."

ناوی نابەم
باوکم بێڵەکەم ئەشکێنـــــــێ
ناهێلـــــــــــــــــــێ باخچەی ماڵەکەمان
گوڵێــکی تر تـــــــر تـــــــــــر...
«فرۆید»خائین بوو
هەم بە من و دایکی خاکـــم
هەم بە باوکم و بەهەشـــــــــت ژیێ
تـــــــۆش باوان ژیێ..
کاکەمت فێرکرد بمکـــوژیێ .. ژیێ..
/ سێ تان بە یەك /
تۆ هۆنەر بوویت و نەرم زا..
تۆ شێعر بوویت و جـــوان زا .
بـــــاوان! زا..
کاکەم هێزی بوو و ئـــــــــــازا ..
/ حەقایـــــــــــــەتی دەسەڵاتی کاکەم/
لە هێزی شێعری تۆوە سەرچاوەی گرت ..
دەمامکەکانی «تابۆ» و
ریوایەکانی دەسەڵاتی !! باوکم
/«تەوتەم»/

لە تۆی زمانەوە بوو و نازیێ..
لـــــــــە چرپەکانتەوە ناز..
لـە ســــــــووری نازەکانتەوە..ناز..
/ تۆ مننت کوشت باوان !
کاکـم ئەوەند دڵرەق نەبوو /
{ـ نازانم ئەم بەشە شیعریەم
لەکـــــــــــــــــــوێ خوێـــــــندۆتەوە، هەر
ئەزانم بە سەر بەردێکی خوێناویەوە نەنووسرابوو
ــــ مێژوو با ناوی تۆی تیا نەبێ باوان !}
خۆت ئەزانی دیکتەی تۆیە !
ئەم « هرەم »ەی گوتن – نووسین،
ئەگەر سەرەوژوور بکرایە !
سەدان باوانی لێنووسرابوو...
/ دیوانەکانی عالەم با خەتی تۆ نەبن باوان ! /
فرۆیدبا بەوەی نەزانیبێ
خۆت ئەزانیت و من / منمان
شاعیر نەبوو تۆ نەنووسێ...
دەمامك باوان تۆ سازت کرد !
/ مەسازم /

ئاخ باوان !
دوژمن بوویت و نەمزانیبوو / نەزاناوم /
دوژمن خۆشەویستە باوان ..
دوژمناویم ..
«جەللاد خوشەویستە باوان
جەللاداویم»
خایین خۆشەویستە باوان
خائیناویـــــــــــــــت
من تۆ بووم و نەمزانیبوو
من ئاشق و ئەشقیش لە تۆ وە هەڵگرسا
ئاشقـــــــــــــــــام
کەچی ئێستا،
رسوای رسوام .. هەڵڕسواوم
تۆ مەزڵوومیت و من !!
/ مەزڵووزاڵماوین باوان /
....................
دایکـــــــــم بە چەکی "نا "ی زمانەوە
دایکم بە بڕوا بە لەززەتی زەوی و
تازەبینـــــــــــی

تازەگـــــــــەری ..

باوكـــــــــــــم، عارف ..

/ حەزی لە بەهەشت بوو و هەتا..

.......... ئێستای "□□□□□" یش

خەو بە خەرمانەكەیەوە ئەبینێ .. /

«نۆستالژی»

تۆش باوان ، كچی دایكمی و شاعیر

زمانت ئەونە بەرز كردەوە یێ

هەموو ئاسمانت پێی شكاند . یێ

پیاو دەرەقەت شیعر نایێ یێ یێ

بمشیعرێنـــــــــــــە ... یێ

پیاو دەرەقەت جوانی نایێ ..یێ

جواناویــــــــــــم كە !

پیاو بەم زۆرە ناحەزەوە دوو ..

هیـــلاك، مانـــــــــدوو .. دوو..

لەسەر مەمكت بمنوێنــــــــــــــــــــە

/ مەمكی دایكم بیر خەرەوە /

سكی دایكم

بەهەشت خۆشترین شوێن بوو

دە بەهەشتێ تر سازكە باوان !

ن

با بگەڕینەوە بۆ بەهەشت مــا

بە دارەكانا سەرئەكەوین بۆ . ئا س

ئەم بەشە لە "هێما"ی ژمارە دوو دا بلاّو كرایەوە .

## گشتمانیـــــــــــن

....... شار، باوش، ئەچێتەوە
خــــــــەون و
من دێمەوە جیهانی خۆم بـــاوان
.. عالەمی شەزەکانی هیـــــچ
و
جیهانی ماچەکانی بێسنـــــووری
حـــــــــــــەز ..
حــــــــــــــــــــــەزام .....
دنیای بەهەشتەشیعر و



جەهەننەمی زانست لە پرۆسەی بـــــوونا !!
خولیای ئومێد !!
لە بازنەی بەرزەخی نەگەیشتن دا
مـــن بە" ن م " و
تـــۆ بە " ۆ ت " نەبێ
بە یەکنـــــــــــــــــــــاگەین .
چۆن ئەبین بە پێچەوانەوە ؟
/ ئەفسانەکان چۆن بگۆزینەوە
بۆ " ئینتێرنێت "
......................
حەز بەش ناکرێ مەگەر باوان ؟
وەك زەجری هەمووەمان بـــــــــــۆ
/ جیهـــــــــــــانێکی بەشـــــــــــکۆ /
........... دەحـــــــــــــــــــەزم .....
باوش دەکەم دایکـــــــــم بە خۆشەویستی
بۆ ساتێ ژین و نەژیـــــــــــــــــــــــا.
.. رووش ئەبمەوە بە باوکما رق
بـــــــــــــــۆ ساتێ مان و نەما .
پاڕانەوەم بۆ تۆ کە مەرگی «بــــــــــــــــا»

/ نابـــاوەڕیٚ /

بـــــــــــــــــه لەشتـــــــــــــــــــــا

بـــــــــــــــــــــــــــــۆ من

شـــــــۆڕ

⇓

ســــــــــەقز لانكەیەكی بچـــــــــــــووك ..

ڕەنگە بــــــــــــــــــــوو

نەیخـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــەواندم ....

دایكـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــم،

تاســــــــــــەییٚک ڕەنگە بوو ... بۆ

ئاواتە وشكەكانی باوكم

بۆ نەژیان وەك خۆیی خۆشكـــــــــــم .

كە هیـــــــــــــــــــــــچ ...

دایكم هیچ نەبوو هیچ

گریان بۆ هەموومان جگە گڕ

یـــــــــا

ن

– باوكـــم هەر منــــــــــــــــــــــــــــــــــــم

بە چاو و برۆ ڕەشــــــــــــەكانییەوە

كە من بۆم سپی كـــــــــــــــــــــــــــــــرد

بە شمشاڵە زەردەكەی دەستیەوە

/ كە من بۆم فـــــــــــــــــــــــــــــــــــڕ .... دا /

بە حەزی منداڵی و پیریەوە لە « فاتیٚ »

/ كـــە مـــن بـــۆم كـوشت /

لە تۆدا ناشتم

لە لەشتا

لەشاوین بە لێشـــــــــاو .....بــــــــاوان !

..................

من دایك و باوكمانین

بە تۆوە !

باوشیٚ خـــــــــــــــــــــــــەون دەچێتەوە

شــــــــــــــــــار

و

جیهــــــــــــــان دەبێتە خـــــــــــــۆم

بـــــــــــــــــــــاوان !

عالـــــــــــــــــــــــــــــــەمی شەڕەكانی هیچ

و

ماچەكانی جیهانی بیٚسنووری ڕق

... ڕقــــــــــــــــــــــــــاوین ⇒ ⇒

له شيعرى بەهەشت و

زانستى جەهەننەم بۆ

/ مــــــــــــــەرگ /

لەم شێعرەساتە قۆڕە دا كە منمانين

منماتۆيـــن

گشتمـــــــان .



## ـ  ـ

## / منداڵ /

سێلاوی......لە هزرت
هەتا .............. من
بە
لیشیاو .
هەتا خۆ/ت
بە
دەگمەن
تا شیعر
شیعرە سات
منمانین .................
/ئەم شەوە چ مزرە /
وەکوو چۆن ... تاڵە رۆژ ...
لە هەلاَ تنی ....
نازانم خۆ / مم

ئاشقانە ئەخزێـــــــــــــــــــــــم
یان پەپوولەیەک ئاگرم ئە دا شەم
.............................
بە خۆڕایی
لە پەنای مێروولەیەکەوە
ئاسمان ئەبژێری
هیچ کاکێشانیک ئێمە نابینێ
کاکێشان ...
من ...مێروولە...
بە سەرشەوێ سۆلاَ باوان
لە هەلاَتنم ئاشقانە / ئەخزێم /
یان پەپوولەیەک ترش ئەمبرژێنێ
............................
بە ناو قورستانی ئەم ئێوارەدا
/ ناچـــــــــــــارە /
بازنەیەک و بەس هەموو بەیانییەک
تاڵە سۆڵ
بە برینجی بەیانی
هیوا تۆی باوان .

ڕەنگی هاڵبوونەوەی دیانم

چ ڕەنگێکە ؟

کاتێ شەو یا بەیانی سیگارێك ئەمژم

بەجێگەی گۆپکەیەك کە نەتهێشت باوان !

شێـــــــــــــــــواوم

وەك « با »

بە ڕەشی شەوانەی تۆ و .............

مزگێنی مەرگانە بە چاوتا

/ ڕێگە دوورە ../

بە دەستەکانتا .. هیوا

خوارەوە نابینـــــــم

.. ڕەش

کەوشەکانت و ئیتر هیچ

وەك فەلسەفە ..

وەك زستان کە برینج ئەباری

↓ ↓ ↓

/ ئێمە نەمانبوو /

خەتای با بوو ئاشقانە تۆرا ..

منیش جگەرەیەك

دەمئاڵێنێ لە باوە دووکەڵ ..



شەوانە تاڵ

ڕۆژانە تیـــــــــــــــــــــژ ..

/ بیبار ناحەزترین ڕەنگە /

کە تۆ نەبی باوان

خوێن سەوزە سەوز !

هەر دەرژێ و

ئەم قورستانە ئێوارە مەجبوورە

من ........

نە سەوز و نە تاڵ

نە ڕەشم نە برینج

/ نەمانبوو / یام

یام

من مناڵی بێگەرد بووم ئەگریام

↑

.......

باوەڕ کەن ئێستاکەش ڕەنگی کورد نازانم

چ تامە ؟

تامەزرۆی تامــــــم

نە جگەرە دووکەڵ ..

بیئاڵێنێ لە باوە من



بێـــــــرەنگم بێـــــــــــــــــــــــــرەنگ ..
وەک زانست کە ســـــــــوورە
خوێــــن
وەک مێژوو کە بێرەنگ
لە منـــــەوە
بۆ باوکــــــــم
بـــــــاوەم
باپیـــــرەم
/ من پیاوم ناوی دایک ناهێنم /
تۆش باوان لە تـــــــــــــــۆوە
داپیرەم
....تا دایەم
تا ...دایکت
شـــــــــــــــۆڕ
ببینەوە
بە شیعرا
کە زۆرە
بە چیرۆکە خەیاڵا
بۆ یـــــــەک ...

شەوانە چ مزر و
ئێواران چ ناچار !!
بازنە ماندالا یۆنگ
لە چاوەکانتەوە باوان
نە هیوا
لە دەستەکانتەوە باوان
نـــــــــــــــە ئامێـــــــــــــز
خوارەوە نابینم
هەر کەوشی منداڵی و
هی ئێستاکەت گـــــــەورە
شییعر باوان ... تۆ
ئەشیعـــــــــــــــــــــــــــــــــــــرم
وەک نامە بۆ ئەو با کە نەهات ...
وەک سوور / کە خوێن ســــــەوزە /
وەک پەپوولە کە ئاگر ئەدا شــــــــــــــەم
وەکوو مەرگ کە ئەفڕێ و ..
/ هەرگیزیش هەواڵێ لە ئەشق ناپرسێ /
پەپوولە .. یا من .. یا تۆمن ..
بە باوە یان بۆران .. چەن ئاوی

بە قژتا چەن سپی وەك برینج

/ نەمانبـــــــــــوو /

ئەم قژەم رەشی رەش وەك جاران ..

باوەڕکە هەناسە ئەتوانێ وەك شیعر

داتپۆشێ لە مەرگا / ژینەمەرگ /

وەکوو سۆڵێ لە منا

شـــــەو

وەك مەجبوور بە ناچار ئێوارە/بەیانی

ئاشقام باوان بە رەنگت

کە بۆنی بێرەنگی تا هەتا ........ من

بە کوڕێ کە بەفر سپی بوو

وەك برینج .. وەك میوە ..

/ نەمانبوو /

قاوەیی ئەو مانگە و

بە زەردی ئەم شیعرە

ــــــــــ شیعرە ســـــات ــــــــــ

مەمانگری تۆ باوان

مەتۆگری با منیش

شێواوم لە



ماچم‌کە تۆزاوی

وەکوو با بە رەنگا چۆن ئەڕوا

سوورم کە سەوز

هەر رەنگێ کە بێرەنگ لە منا

تەنانەت خەیاڵی

شێعرەسات

لە تۆ دا

رەنگ .. رەنگ ..

بێرەنگی تۆ منم لە خۆما

هەناسەت

تا .... هـــــــــــــەتا

وم شێـــــــــــوا باوان !

وەك رۆحی شیعرێکی« دادایی »

وەك زمان

مێروولە لەپاڵتا ئەژمێرێ کاکێشان
ئاسمانیش بچووکە بڕوانە ،
مێروولەی کاکێشان
لە چاوتا چ بێدەنگە .
.............
گەرمامە چاوم بۆ تۆ ...
تۆی ئێستای /20000/
وەک باوان
کە رەنگی بە باوش دەهاورد..
خەیاڵە .. خەیاڵە ...
شێعرە سات
/ فەلسەفە و زانست و بەیانی /
وەک زمان کە شێواوم ئێستا
نازانم
بەرەنگی جگەرە و شەراب و
.....یاخـــــــــــــــی بوون
بە رەنگی قژ .. یان دیانت
/ وەک برینج نەمانبوو /
وەک سەعات هەمەرەنگ

/ نیمانە /
..... زەمەن .....
ئاخ باوان شێواوم
هیچ تامێ نازانم
وەکوو رەنگ ..
چ رەنگە مێژوومان ؟
چ رەنگە زانستمان ؟؟
چ رەنگە ئەم ئەشقە شێواوە ؟؟؟
/ نازانم / کورد ..
هەناسە تاڵە سوێ
یا مزر ..
خوارەوە نابینم هەر کەوش و
ئەویش رەش
وەکوو شیــر ..
وەکوو بەرد ...
بە لەشما
پەپوولە .. واوێ ش م
ش ا و ێ م و
ش و ێ ا م و

م و ا و یٚ ش   تا .. هەتا
مە ترسە لە ڕەنگی ئەم شێتە
ئەم « قیژە بۆرانە»
لە چاوما ..
/ وەک مێـــــــــــــــــــــــــــــــژوو /
لە لەشما
/وەک یەکەم سپی تال لەسەر سینگ /
مەترسە لەم تامی ئەوینە مەرگە
خوینە خوێن سەوزە وەک هەتاو
کە شەونا / زبرەشەو /
لە نەخشی ئەم باڵەی پەپوولە
/ هەلمٚ کەند نە مزانی
هەنسک و
قامکی ڕەنگالەٚم لەباڵی پەپوولە
/ من شەوان بە شەوقی شەپۆڵ و
بەیانی
بە ئەشقی دڵیکی پێوەری ئەقیانووس
هەلئەسام .../
ــ ها .. ها .. ها ..«شاعیری بیٚ دیوان! »

لە بەفر کە زستان ... بە هاوین
وەک پلاٚو
جەژناو جێژن
وەک بۆنی حەمامی جێژنانەی بەیانی
/ ئێستاکەی 2000 /
ئەستێرە نزیکە
دەستی مە چەن درێژ / یۆتۆپیا /
چاڵترین بەرزایی ئەندیشە و
حەزترین
ڕەنگەکان
ڕەنگاوی بێرەنگیم
لە درد و لە خۆشی
مەرگەژین
بۆ ئەشق و هەناسە و
خوارتریش لەنێوان دوو پادا
باوێشکێک ... ڕاپەڕین
تەزوویێکی ڕەنگین
لە ماچ ...

منداڵ و
ناچاری ئێواران
رقاویم باوڕکە
بە قەد خۆر ساردداوی
بە قەد مانگ گەرم و گوڕ
رچاین ... رچاین ... رچاین
لەگەمە و دەمامک
/ رەنگە شێعر قۆڕترین دەسەڵات /
لە باوکم تا ئێستای 2000
/ دایکم نا ... من پیاوم .../
ئەوەندەی کاکێشان بچووکین
/لە عەشق و حەز و مەرگ / شیعرەسات
دەی باوان
تۆ شیعرت پێخۆشە
من شاعیر

بە تۆوە ئەرەنگم
« باوانەکەی باوکی .. چاوم بینایی ../گۆرانی/
ئەو تیرە هاوێشتت...

لەجگەری داوم ... /گۆرانی/
حەز ئەکەم هەتا رۆژ کە نایێ
بتلێم و
هەتا رەنگ /کە نیمە/ بتنۆشم
/ بە چاوت / کە نەرم /
وەك سەوز و
بەدستت کە یاخی
دوا تریش
خەونە خەون لە باران
........
............
لە هەوریێ ئاوس و
/ یۆتۆپیا /
ئەرزێکی قاقڕ و ژیلەمۆ..
/ تا باران /
هەڵم دە بە سەرتا
«باوانەکی باوکی ئەی بینایی شیعرم..»
/ قۆڕترین دەسەڵات /
لە بیرتە،

جیهانی ئەندیشە و ڕەنگاڵە
بە نامە و
چیروک و
بە شیعر .. .
هەتاکەی ؟
تەمەنی ئەم ئەرزە چەند کورتە و
ئێمە بۆ ئەوەندە لەیەیک دوور
بازێک ... هەزارباز
هەتا کوێ ؟
نازانم !
بازنەیە و



قەڵەمیش ئەپیێوی
/شعری چی ؟؟/
بەقەدەر عومری خوا
شیعراویم
بەقەدەر ئەستێرە نزیکم
لە شەری ئەشق و تۆ
/لە بیانووی باوکانەم /



بۆ سوارۆ
و بۆ بێگەرد..یا سۆران
بۆ پەری کە چاوی وەکوو شین
ئەمگرێ و ...
باوان ئۆی ئەم شیعرە
کە شێواو
وەک زمان
وەک مێژوو و دەسەڵات ...
ئاوێزانم
شۆڕ
شۆڕ
تا تۆ   تا من کە منتۆم
هەتا کەی؟
باران ونەبارین
هەورێکی قاقڕ و
ئەم ئەرزەش تا ئاوس..
بە باڵی هەناسە
بەئەشقی بێ ئەشقی
← بێدەنگی →

سەوزاویم ....ئابە سەوز
یان رەنگیٚ
نەئیتر... بیٚرەنگی هەتا کەی ؟
نە شیٚوام
شیٚواوم .....تیٚکچوونیٚک
هەتا ... بەرد
.................
تۆ باوان
شەویٚکی بەنەوش و ...
/ـ ئەم کیٚشە شیعریەچ زالْە بە سەرتا بیگۆرە /
لە جگەری داوم .. گیان! لەجگەری داوم .گیان !
لەجگەری داوم ../گۆرانی /
ئەگەر من هەتا چەم
بە کیٚوا سەرکەوم /بەچەندە؟/
ـــــ بە چەندە ماچت کەم ؟
ـــــ بە چەندە ئەو گولْە؟
ئەم شیٚعرە؟
ئەو وشەی نیٚرگسە؟
حەزیٚ خۆش بەچەندە؟

ئا..را...می..
ئیٚستاکە شیٚعریٚکیش ناتوانم
ئەفرۆشم!
{ وەك ئیٚوە كە خاك و
پیاوەتی و
/چەند رقمە لەم وشەی پیاوانە/
كە شەرەف
زۆر جاران ولاٚت و
ئاسمان و
ئەستیٚرە تا.....شیعر }
ــ بەچەندە ؟..
ماچیٚك و دوو بیرە ؟
حەزیٚك و دوو شیعر و ساردیەك
ماستاویٚ حەساویش
بۆ خۆم و
ولاٚت و
دەسەلاٚت
ئیٚستاكە ناتوانم  شیعرەسات
تەواو بوو

ئەو نەشەش ...
یا عومر تا جارێ تر کێشان
یا عومر تا جارێ تر وشە
هاورێیی
یان شێتی
یا سەفەر..... تا هەتا ....
ئەستێرە و
ئاسمـــــــــــان و
کـــــــاکێشـــــــــــــان..
ها..ها..ها..
ــ کەمەتر لەشیعر و لە وشە نییە... نا
چەند خۆشە نازانی چی ئەڵێم
ــ بەدەرەك
چەند حەزە دەرەك و
نەوەستان
تا..............باران
تا ........رەنگی پەشیمان
/ بێدەنگی دەسەڵات /
هێز ترم لە هەرەس

نەمرووخا
بە شەیتان!
شیعرەسات مەنتقی بێرەنگی
لە خۆ / م و
تۆ، با/وان
تا بە بەرد..
بە لەشما شۆڕ
هەرزانترین وشەیە
ئازایی ..
بەسە بەس !
تۆ باوان
شینم کە
تا......باران
. . . . .
. . . . .
. . . . . .
ها..ها.. ها..
ــ چەند خۆشە نازانن دەڵێم چی !!

بازنەیە و قەڵمیش ئەپێیوێ

حەوتەمین شێعرەسات...

---

لە گۆڤاری زرێبار ژمارە 13 دا بلاّو كراوەتەوە/بەهێندێ هەڵەی چاپیەوە .

لە سروەی ژمارە 174 یشدا هەر بەو جۆرە.. بلاّو كرایەوە



## __ 8 __

به ئەوەندەیی کۆچ و
ژمارەی کۆچەرەکانی خەندە
لە گەڵتا ئەگریم
ئەی کچی نازانم کوێنەری!!
درۆیە ئەشق!
من لە چاوەکانتا
فلیمی رۆحی خۆم ئەبینم
تامەزرۆ
گەورەیی شیعرێکم ئەتاشم
/ لە بەژنت /
زمانی دێڕێکم ئەشکێنم
/ بەپرچت /
بە هەرچی مەممکتە
بۆنێکی ئەهوورا ئەبەخشم
بە وشەم ←
درۆیە ئەم ئەشقە مەفریوێ !
/ من شیعرم ! حەرامزاو.../
ئەتکەمە سەردێر و پەریایی ،
بە رووتی ئەتبەخشم بە چەپڵە.
/ کە پەریت /
مەخۆشە !.. درۆیە ئەم ئەشقە !
شەوقەشووم شەویلکەی شەوانە
...... لە شیعرا .............
ئەشقی چی؟!
{ شەوانە شەهیدم شەقەشەق شقارتە
شەق ئەکەم }
ئەی کچی نازانم کامە ماچ
کردمیە هەرێمی بێناویت؟
شیعرم دێ کوا لێوت.. بینووسە!
کوا قژت / گەڵای دار/
داپۆشە!

کوا چاوت بمنۆشە

بە سینگت رامژەنە

شێعرم دێ ری ..

بیگرەوە با نەفرێ ڕێ..

لە شەوتا چ چاوە.. بمبوورە

لە چاوتا چەند شەوە بەیانی

مەپرمە نامەوێ....

کوا لێوت شیعرم دێ !

{ بە ماچێ مەزانە ئاشقم }

چەند درۆ بە شیعر ئەنەخشێ لە ژینا..

بە مێژوو..

چەند مێژوو کە نەژیا لە شێعرا..

بە چیرۆک

هەناسە هەتا.....من بم بەتۆ درەنگە

درۆیە ئەم ئەشقە

ئەی کچی ولاتی نازانم کامە رەنگ



.....

ئەبەخشم بە ماچێ ناتهەوێ ؟

من بە شەم پەپوولە ئەفرۆشم تا.... ئاگر

بەسە بەس ..بمبەخشە بە شیعرێ

بمبوورە بە گازێکی نینۆک

نە عەشقم بپرژم بە لەشتا ..

/ ولاتان بسووتێ /

{ ئەگەرچی هەمووتان لە بانی شەپار و

شەلیم و

شقارتە

شەکەتن..} /قسەی قۆڕ/

بە من چی تۆ ئەشقت پەرۆشە

لە شیعرا !

ژیان قەت وەکوو من ناشیعرێ

وەکوو تۆ نائەشقێ

کەواتە بیخەرە دڵتەوە تا زووە

با نەفرێ

ئەم شیعرە

شەوانە شەهیدم ..بە ئەوەندەیی خەندە و

ژمارەی کۆچەرەکانی ئازار لە لەشما /بە چوونت /

لە گەڵتا «ئەکەنم»

باوانی ولاتی نازانم کوێنەری ؟

لە خۆ/مای
بە مەرجی دەمامك
بە شەرتی سیاسەت
بە شەوقی یۆتۆپیا..
بەتاسەی رەنگاڵەی ژیان و
بێڕەنگی ژنانە پیاوانەم
درۆیە ئەم ئەشقەم
لە چاوتا هەتاوی چیرۆكێ ئەبینم
كە رەنگە بینووسم
لە شەودا
بە بەژنت پەیكەرێ ئەتاشم لە جەستەم
بۆ درۆ كە مێژوو..ها..ها..ها..
لە پرچت ئاڵۆزم, بۆ چەپڵە ..بانگم كەن
گەورەتر لە تۆ بم { نەخۆشم /فرۆیدی/ لە لەشتا}
ئێواران بە نەختێ «مامۆستا» و
بەیانی بە تۆزێ شیعرەوە ئەتنۆشم
بەشم دە لە لێوت
بۆ شیعرێ كە سووراو
بەشم دە لە چاوت

{ فلیمی رۆحی ئەم شیعرەسات كە خۆ/مم }
بە تەنیا و تەنیایی لە تۆدا
نازانم نە ئەشقە ئەم خوازەم
هەژینی هەناومە بە تۆوە
ئەی كچی نازانم چەند شیعر لەمەوبەر
بە سەرتا هەتا كەی درۆ كەم
بیگرەوە با نەفڕێ، فڕ
فڕەی شیعرەسات...
مەگری نا
/ئەمە من ..هەر بۆتۆ /
ئیتر قەت بەراستی ناشیعرم
تۆ بگریت باوانم
نەمزانی لە كوێوە هاتیتە ئەم شاری
نەشیعرەم
شیعرە سات
ئەزانم
شەقشەقەی منالیم بە وشە نازانی
ئەزانم گۆرانی ناباریێ لە تۆدا

نازانی هەر باران وەکوو من

ئەشیعریٚ ←

بۆنێکی خودایی ئەبەخشم بە فیلمی رۆحی خۆم

لە چاوتـــــــا

ئەزانم قۆڕترین دیوانە شیعرە سات

ئەزانم نازانی زریکەی ئەم شیعرە زیندووە

لە نەبـــــوون

کە خۆ/مـــــم

بە دەشتیٚ گەورەدا رۆ

ئە

چم

بە ناخیٚ بچووکا

ئەتۆری

نازانی تۆ باوان

کە هێشتا ناوەکەت نازانم

چۆن هاتیتە شیعری بیٚ درگا و پەنجێرە

/ وەک هەتاو کە نەمبوو لە زیندان /

ئەمنووسی

/ وەکوو مانگ کە ئەستێرە شینە لە شیعرا /

بەشم دە بە چەندە ئەم ئەشقە مەفریویٚ

/ من شیعرم حەرامزاو /

ئەتکەمە سەردێر و وەک چەپڵە

بەگران ئەتبەخشم

.......... بە پەری..........

............................

شەقشەقەی ناو بێشکەم لەبیرە

/ نەگریـــــــــــان /

بە ئەوەندەیی کۆچ و

بە ژمارەی کۆچەرەکانی خەندە

لەگەڵتا ئەگریم

/ئەزانم ئەزانی کە شێتم /

نایەڵن چاپی کەم مەترسە!

ئەم دێڕانەی دوایی بنووسە ناتوانم

/ شیت بوونیش وەکوو شیعر ساتێکە /

خوایەگیان !

بە چەندە شێتێتی تا...... هەتا...

خۆت ئیتر بینووسە...

خوات لەگەڵ ئەی شیعر و

ساتەکان!.................

..........................

...........................

...........................

...........................

...........................

.................................

...........................

...........................

بە من چی شیعرە سات؟

---



# _9_

{ چم لەمار و عەقرەب داوە؟

من بۆ گوڵێکی رەنگاڵە عەودالم و کێشەم هارمۆنیای رەنگەکانی

تۆیە ..}

لە سپیدەدا چۆن ئەنوێنێ ...

کە خۆرەتاو تێیدەئاڵێ

چۆن ئەگۆردرێ ؟

مانگی ئاشق

چۆن دەخزێتە سوورەکانتەوە؟

هەڵدەکشێ بۆ سەوزەکانت؟؟

{ مار بەمن چی دووپشک لەت کا، یان دوو پشکێ

ئازایانە( !!) ژاری رق بە مار بچێژێ}

**ژەهر ناشیرینترین رەنگە باوان!**

/ ئەم دروشمەم وەک شیعر لێ وەرمەگرن/

جیهان لێوە سوورەکانی تۆیە و

گەردنە زەردەکەی من و

چاوە سەوزەکانی تۆ

کە بەردەوام

ئەشە

کێنە

وە

باوان

{ با دووپشک و مار یەک بخۆن ــ ~~مێژوو~~ ــ}

شیعریش :

سروودێکی ئەبەدییە

بە رەنگەکانی تۆدا و

هیجرەتی ئەزەلی

من ... تا

گەرانەوەم

بۆ تۆ ←

/ هونەر/

{ ئەمە گەردنی من و

ئەوەش رەنگەکانی تۆباوان!}

بە من چی مار یا عەقرەب .....

ئەفسانەکان ئێمەین

لە پووچییەتی مێژوو دا

لە حەیبەت ترس لە مەرگ و

خۆشەویستی رەنگەکانی ژیان باوان

{ مار.. عەقرەب .. ترس..مەرگ}= «کیرکێگارد»

دنیا ئەونەی ناوێ

ئەشق شیعر و ئەفسانە ساز ئەکا

ژیانیش:

رەنگەکانی تۆن باوان

{ منیش عەودالّی هارمۆنیای رەنگەکانتم

گولّێکم دەست کەویٚ یا .... نا

بەمن چی مار مردانە یا نامردانە،

دووپشکێکی ئازا یاخۆ خوێری شەق کا،

یان دووپشکیٚ....}

سپیدە ...

خۆرەتاو...

مانـــــــگ...

ئەشق و گولٚ...

ئەمەگەردنی من و

ئەوەش شیری رەنگەکانی ژیان باوان!



---

بەشێك لەم شیعرە لە «تەلخا» دا بلاّو کرایەوە

# _10_

ماوم ، ماواوم ...ماواویانم...

هەتیو!

{ ئەمە چەند جارە ئەشێعرێنی!!}

لە م/ ن ەوە

زمان

تا خۆ/ت

{بلاّ منیش لە لابیرێنتەکانی مێژوو

فەلسەفە و

زانستی ژن ەوە}

بێمە ناو ئاوێنەتانەوە

کەم پەڕە ناو ئاوێنەکەی باغەڵمەوە!

شانە دارەکەی هەجیجیت

ئێستاش لامە

و ... عەترەکەی ئاهووی خوتەنت

سەدان جارە

ئەمفریویناوێ

شیعرم پێخۆشە، ئابە ئەتنۆشم

بەپرچە سپیەکانی چلچەمە سوێند

کە دایە گەورەم

دایەم ...

دایکم

{ناوی پیاو حەقمە نەهێنم}

هەتیو!

/ چت لێبکەم؟/

«کە شەرفتان منم »

که ئەمکوژن

به ڕدووکەوتنێکی ئەفسانەیی لەگەڵ «مەمم»

ـــ« شۆڕ دەبیتەوە بە لقی هەزار بە هەزاریٚ

ئامۆزا سیامەنیٚ

مەناڵە مەناڵە گۆر غەریبەکەم

به دار و دارەبەندەوە..مەناڵە..»

ـ کوڕیٚ مردم

به هەرمێکانمەوە که تۆ

وەك نارنج بۆنت دەکرد و

پلیشاننتەوە بۆ

منیٚ تر..

به سێوەکانمەوە که دەتچڕی و

فرێت ئەدا بۆ منیٚ تر تر...

به ڕەنگەکانمەوە

که دەتشەکانەوە

بۆ ئالاٚی تر تر تر منیٚ

که تا...... بازنه

به چیتەوە نەتگریم

من کچ!

به چیمەوە شیعراویم

که تۆ

{ له نۆ شێعرەساتی خەونت دا

من چەند جار }

له یەك شیعرەساتی مندا

تۆ.. تۆ.. تۆ.. تۆ.. تۆ

تۆ.. تۆ.. تۆ.. تۆ.. تۆ

تۆ.. تۆ.. تۆ.. تۆ.. تۆ

« به دوازده برا و نۆ ئامۆزامەوە»

له دەورت گەڕێن هەتیو!

که من خەجیٚ

تا تۆی......... مێژوو

و.. منی بیٚ مێژوو

لەمنی ڕەنگاڵەوە تا تۆی

بێرەنگ

تامی کورد نازانی ؟

تامی من چی؟؟

به لێوەوە که گەستت

به هرەمەکانمەوە که

نەمهێشت..

شیعرە سات

تا 2000 یش رۆشت

من هەر نەنووسرام

لێوە رەنگاڵەکانم نەبێ

کە شەرەفت

ئەمکوژن

بۆ تۆش دەمرم هەتیو!

کە مێژوو ...× 2

من √

(من)

«من»

من

{ ئەوەند خرامە کەوانەوە ..

ئەوەند فاکتۆرم لێگرا..بابان!}

باوانێکم و هیچ

تا فرێم ئەدەی

وەک منەکەی تر و

تر تر تر کچەکانی وەک «ژاندارک»

قرةالعین

شیعرەساتی من گریان

گریان

گرمام هەتیو!

تەنانەت شیعر منم کە تۆ

——— دزیت ———

زمان منم کەتو

دەسەلأت

چیروک منم —— قاچاخ ——

قاچاخانیانە .. سیمام

« سنورر»

تف!..................

.....................

دەمم بشکێ هەتیو

تۆ منی یا من تۆم

{ من خەتکێشراوم و ئێستاکەش کە ئەمسرنەوە،

دەبێ سەدان جار

رووت ببمەوە

لە کانالّە ..گانی ..«سەتەلایتا»

که   ئازادم }

قژم بکەم بە«ئینترنێتا»و ...«دکۆلۆرە»

کە ئازادم ... دوای 2000یش

هەتیو !

شانە دارینەکی هەجیجی و

ئاوێنەکەتم

کەخۆت

پەیتا.. پەیتا

فڕێ ئەدەیتە منەوە

بۆ شیعرە ساتی کە هەمووی تۆی

بە خەمەکانتەوە کە

چاوم

تا

پاژ

نە

م

لەگەڵتێم

«وەك بە ختەکەی من رەشە

خاڵەکەی سەر رومەتم»   /گورانی/

«پەنا دیوارە

هەتیو مەکە

دایکم ...شیرەکەم

سەعات لە دوازدەی...

پیاو مەنێرە

خۆم دێم ..»

کە ئەشێ نەێیم !

کە ئەبێ بتکوژم

کە چی من

دەمم بشکێ هەتیو!

جارێك

دەمکوژی

ت

جارێکیش

بۆ تۆ

دەمکوژیت

تاوەکوو..ـــــــــــــــ ئاخرین شیعرەســـا

□

---

*شيعرةسات شيعرة خةوونيَكةلة دة قاشي زيهـ دا.
بةداخةوة باوةكوو ئةم شيعرانة زؤرترين كارتيَكرد
لةسةر بةرةي نويَخوازا كوردستا ئيَران هةبوو بةلاَم
جطة بةشي 2و 7و بةشيَكي 9مةوداي بلَاوكردنةوةي نةبوة.
شيعرةساتةكان ثيَكةوة لة سالَي 2000دا لة ئيَوارة شيعريكدا
لة هؤلَي كتيَبخانةي سةقز خويندرايةوة و لة لايةن
زؤركةسةوة خراية بةرباس و رةخنةكاري.. ئةوخويَندنةوة
بة CDوكاسيَ ويديؤيي بلاَوكراوةتةوة، بةلاضم بةداخةوة
هة ٍ ديَري سةرةكي تيَدا «حةزف»كراوة..